# یەك خواپەرستی بۆ نەوجەوانان

نوسینی

محسن محمود سلیمان

پێشنوێژ و ووتار خوێنی مزگەوتی
صەلاحەدینی ئەیوبی

زەڕایەن

چاپی یەکەم

١٤٤٠ ك ٢٠١٩ ز

## خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾

واتە: تەنها بەندایەتی بۆ پەروەردگار بکەن و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن لە پەرستندا.

# بـــــــــــــیر و بـــــــــــاوەڕی مـــــــوســــڵمـــــان



**لا إلەإلا اللّە**

**جگە لە خودا هیچ خودایەكی تر شیاوی پەرستن نیـــــیە**



**محمد رسول اللّە**

**محـــمد پەیامبـــەری خودایـــە**



**ربی اللّە**

**پەروەردگاری مـــن اللّە یە**



# أناأعبدربی

# من پەروەردگاری خۆم دەپەرستم



# أنا أحبّ ربی

# من پـــەروەردگـــاری خـــۆمـــم خـــۆش دەویـــــت



# پێرست

## پێشەکی

**سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و سەڵات و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ و یار و یاوەران و شوێن کەوتوانی بەگشتی هەتا ڕۆژی دواى.**

**لەبەر ئەوەی کە بابەتی بیرو باوەڕ بە گرنگترین بابەتی شەرعی دادەنرێت بە پێویستم زانی پوختەیەك بنووسم بۆ جگەر گۆشە کانمان لە شێوەی پرسیار و وەڵامدا و زۆربەی ئەو باس و خواستانە بگرێتەوە کە پەیوەندی دارن بە بیر و باوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلامەوە،ئەمەش خۆی لە خۆیدا گرنگی دانە بە پەروەردەکردنی نەوەکانی دوارۆژ لە سەر بنەماو بنچینەیەکی پاك و بێگەرد و دوور لە خوڕافات و شتە بێبنەماکان هەروەك چۆن پێغەمبەر صلى الله عليەو سلم ئامۆژگاری عبدالله ی کوڕی عباسی مامی دەکرد و پێی دەفەرموو:**(( يَا غُلَامُ إِنِّي مُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ ، يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلْ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ ، لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ ، لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ ، رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ ، وَجَفَّتْ الصُّحُفُ وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ ، وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يسْرًا )) والصَّحِيحَة: (٢٣٨٢).

**واتـە:ئـەی عبـداللە بەڕاسـتی ئەمـەوێت چـەند ئامۆژگارییـەكت فێـر بكەم: پارێزگاری لە فەرمانەكانی خـوای گـەورە بكـە پـەروەردگاریش تۆ دەپارێزێت،پارێزگاری لە فەرمانەكانی خوای گەورە بكە دەبینیـت چۆن پەروەردگار پارێزگاریت لێ دەكات، لـەكاتی خۆشـحاڵی و دەوڵـە مەنـدیـدا خـوای خـۆت بناسـە پـەروەردگاریش لـە كـاتی ناخۆشـی و هەژاریدا ئاگای لێت دەبێ و دەتپارێزێت، ئەگـەر پاڕایتـەوە تـەنها لـە خوای گەورە بپاڕێرەوە، وە ئەگەر داوای پشـتگیری و كۆمـەكیت كـرد تـەنها داوا لـە خـوای پـەروەردگار بكـە،چـاك بزانـە ئەگـەر هـەموو ئومەتی ئیسلام كۆببنەوە بۆ ئەوەی سـودێكت پـێ بگەیـەنن نـاتوانن مەگەر خوای گەورە لەسەرتی نوسیبێت، وە هەروەها ئەگـەر هـەموو ئومەت كۆببنەوە بـۆ ئـەوەی زیانێكت پـێ بگەیـەنن نـاتوانن مەگـەر شتێك نەبێت كە خوای گەورە لە سـەرتی نوسـیبێ، تـازە قەڵەمـەكان بـەرز بونەتـەوە و نوسـراوەكانیش ووشـك بونەتـەوە، وە بـاش بزانـە سەركەوتن لە گەڵ ئـارامگرتن دایـە، وە كرانـەوەی درگـای خۆشـحاڵی لەگـەڵ ناڕەحـەتی و ناخۆشـیدایە، وە لەگـەڵ هـەمو ناخۆشـییەكدا چەندین خۆشی تر هەن.**

**دەبینین پێغەمبەر صلی اللە علیەوسلم لـەم فەرمودەیـەدا كۆمـەڵێك ئامۆژگـاری جـوانی بــە عبــداللە فــەرمووە لــە یەكخواپەرسـتی و پاراستنی سنورەكانی شەریعەت و پشت بەسـتن بـە خـوای گـەورە لـە هـەموو كاروبارەكانیـدا و ئـارامگرتن لـە سـەر خـوا ناسـین و هـەموو**

**نارِەحە تییەکانی ژیانی دونیا و رِازی بون بە قەزا و قەدەری تالْ و شیرین، بۆ ئەوەی هەر لە منداڵییەوە پەروەردەی بکات لە سەر چۆنێتی بەندایەتی و خۆپاراستن لە تاوان و سەرپێ چییەکان.**

**بۆیە بە باشم زانی ئەم نامیلکەیە بخەمە بەردەستی جگەر گۆشە کانمان بە هیوای ئەوەی سودی لێ ببینن و ببێتە سەرەتایەك بۆ پەرستن و ناسینی خوای تاك وتەنها.**

**محسن محمود سلیمان**

**پێشنوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی صەلاحەدین/ زەرِایەن**

**١١/١ / ١٤٣٧ ك ٨/٥ / ٢٠١٦**



# ناسینی سێ بنەماكە

## بنەمای یەكەم : ناسینی خوای پەروەردگار

## من ڕازیم الله پەروەردگارم بێ

**پ١/ پەروەردگاری تۆ كێیە؟**

**و / پەروەردگاری من ئەو خوایەیە كە منیش و هەموو بەندەكانی بە نیعمەتەكانی خۆی پەروەردە كردوە وەك فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾سورەتی فاتیحە.**

**واتە:سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ ئەو خوایەی كە پەروەردگاری جیهانیانە.**



**پ٢/ كێ تۆی دروستكردوە؟**

**و/ ئەو پەروەردگارەی كە منیش و هەموو دروستكراوەكانی تریشی بەدی هێناوە، وەك پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ...(٦٢) ﴾ سورەتی زومەر.**

**واتە: خوای گەورە خوڵقێنەر و بەدیهێنەری هەمو شتێكە.**

**پ٣/ بەچ شتێكدا پەروەردگاری خۆت دەناسیتەوە؟**

**و/پــەر وەردگــاری خــۆم دەناســم بــە دروســتكراوەكان و نیشانەكانی وەك: شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ ئاسمان و زەوی وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ....(٣٧)﴾** سورەتی فوصیلەت.

**واتــە: لــەو نیشــانانەی كــە بەڵگــەن لەســەر تــاك و تــەنهای پــــەروەردگار شــــەو و ڕۆژ و مــــانگ و خــــۆرە.**



**پ٤/ كێ بە تەنها شیاوی پەرستنە؟**

**و/ خوای گـەورە بەتـەنها شـیاوی پەرسـتنە وەك پـەروەردگار فەرموویـەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ(٢١)﴾** سورەتی بەقەرە.

**واتە: ئـەی خەڵكینـە ئـەو پـەروەردگارەتان بپەرسـتن كـە بـە نیعمەتەكانی خۆی ئێوە و خەڵكانی پێش ئێوەشی پـەروەردە كردوە و لە نەبەبوونەوە هێناونییە بـوون، بـۆ ئـەوەی بچـنە ڕیزی تەقوا كارانەوە.**

---

**پ٥/ حیکمەت چییە لە درووستکردنی مرۆڤەکان؟**

**و/ خوای گەورە مرۆڤەکانی درووست کردووە بۆ ئەوەی بیپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێین وەك پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ( ٥٦ )﴾سورەتی زاریات.**

**واتە: من پەری و ئادەمیزادم تەنها بۆ پەرستنی خۆم درووستکردوە.**



**پ٦/ ئایا درووستە بەندایەتی بۆ جگە لە خوای گەورە ئەنجام بدەین؟**

**و/ نەخێر لەسەرمان واجبە تەنها بەندایەتی بۆ خوای گەورە بکەین و هاوبەشی بۆ دانەنێین وەك پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ( ٣٦ ) ﴾ سورەتی نیساء.**

**واتە: بەتەنها بەندایەتی بۆ خوای گەورە بکەن و هاوبەشی بۆ دامەنێن.**

---

**پ٧/ ئاسمـــان و زەوی لەچـــەند ڕۆژدا درووســـتبووە و كـــێ دەیبات بەڕێوە؟**

**و / خـــوای گـــەورە ئاسمـــان و زوی لـــە شـــەش ڕۆژدا درووســـتكردوە و بەتـــەنها خـــۆی دەیبـــات بـــەڕێوە، وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الْـأَمْرَ ....... (٣)﴾ سورە تی یونس.**

**واتە:بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە كـە لـە شـەش ڕۆژدا ئاسمانـەكان و زەوی دروو سـتكردووە و پاشـان بـەرز و بڵند بوەتەوە بۆ سەر عەرش و هەر لە وێیشەوە كـار و بـاری بونەوەر دەبات بە ڕێوە.**



**پ٨/ كـێ خـۆر و مـانگی درووسـتكردووە و ڕونـاكی پـێ بـە خشیوە؟**

**و/ خوای گەورە خۆر و مانگی درووسـتكردووە و ڕونـاكی پـێ بەخشیوە وەك پـەروەردگار فەرموویـەتی:﴿ هُـوَ الَّـذِي جَعَـلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا....... (٥)﴾** سورەتی یونس.

**واتە/ ئەو خوایەی کە ڕوناکی بە خۆر بەخشیوە و مانگی ڕۆشن کردووەتەوە.**



**پ٩/ کێ ئەو زەوییەی درووستکردووە کە ئێمە لە سەری دەژین؟**

**و / خوای گەورە ئەو زەوییەی درووستکردووە کە ئێمە لەسەری دەژین وەك پەروەردگار فەرمووییەتی:﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ .....( ١٥ )﴾ سورەتی تەبارەك.**

**واتە: خوای گەورە زەوی بۆ ئێوە ڕامکردووە بۆ ئەوەی بتوانن بەئارامی لەسەری بژین دەسا ئێوەش بگەڕێن بە هەموو شوێنەکانیدا و ڕۆزی خۆتان پەیدا بکەن.**



**پ١٠/ کێ باران دەبارێنێت؟**

**و/ خوای گەورە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت وەك پەروەردگار فەرموویەتی**

**:﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا..... ( ٢٧ )﴾ سورەتی فاتیر.**

**واتە:ئایا ئێوە نابینن کە چۆن خوای گەورە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت و جۆرەها میوەی بەتامتان بۆ دەردێنێ کە جیاوازن لە قەبارەو ڕەنگ و شێوەدا.**



# بنەمای دووهەم:

# ناسینی ئاینی ئیسلام بە بەڵگەوە

# من ڕازیم ئیسلام ئاینم بێ

**پ١/ تۆ لە سەر چ ئاینێکیت؟**

**و/ مـن لەسـەر ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلامم چـونکە تـەنها ئـەم ئاینـە لـە لای پـەروەردگار جێگـەی ڕەزامەندییـە وەك خـوای گەورە فەرموویەتی:{وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا...(٣)} سورەتی مائیدە.**

**واتە: وە من ڕازیم تەنها ئاینی ئیسلام ئاینی ئێوە بێ.**



**پ٢/ ئیسلام بریتییە لە چی؟**

**و/ ئیسلام بریتییـە:لـە تەسلیم بـوون بـۆ خـوای گـەورە بـە پەرسـتن و ملکـەچ بـون و گوێڕایـەڵی کـردن، وە خـۆ دوورخستنەوە لە هاوبەش دانان و لە وانەش کە هاوبەش بۆ پەروەردگار دادەنێن.**

**پ٣/ ئیسلام لەسەر چ بنەمایەك دامەزراوە؟**

**و/ ئیسلام لەسەر بنەمای شایەتومان دامەزراوە ( لاالە الا الله محمد رسول الله ) صلى الله عليه وسلم.**

**پ٤/ چ ئاینێك دەبێتە مایەی خۆشحاڵی بۆمرۆڤەكان؟**

**و/ تەنها ئاینی ئیسلامە كە مایەی خۆشحاڵی و ئاسودەییە بۆ مرۆڤەكان وەك پەروەردگار فەرموویەتی:{بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ( ١١٢ )}** سورەتی بەقەرە.

**واتە: تەنها ئەو كەسانە دەچنە بەهەشتەوە كە خۆیانیان تەسلیمی پەروەردگار كردووە و چاكە كارن ئەوانە پاداشتی تەواویان هەیە لای پەروەردگار و هەروەها نە ترسی دوا رۆژیان هەیە ونەخەفەتیش بۆدونیا دەخۆن.**



**پ٥/ ئاینی ئیسلام لە چەند پلە پێك هاتووە؟**

**و/ ئاینی ئیسلام لە سێ پلە پێك هاتووە كە ئەمانەن:ئیسلام و ئیمان و ئیحسان.**

**پ٦/ پایەکانی ئیسلام چەندن و کامانەن؟**

**و/ پایـەکانی ئیسـلام پێـنج پایـەن وەك پێغەمبـەر صـلی الله علیەوسلم فەرموویەتی:(( بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، وَإِقَامِ الصَلَاةِ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ ))** ئیمامی بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە

**واتە: ئیسلام لە پێنج پایە پێکهاتووە کە بـریتین لـە مانـەی خوارەوە:**

**١/ شـایەتی دان بـەوەی کـە تـەنها خـوای پـەروەردگار شـیاوی پەرستنە و محمد صلی الله علیه وسـلم بەنـدەو پێغەمبـەری ئەوە.**

**٢/جێبەجێکردنی پێنج فەرزەی نوێژەکان لە کاتی خۆیدا.**

**٣/ ڕۆژوو گرتنی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان.**

**٤/ بەخشینی زەکات لە کاتی خۆیدا.**

**٥/ ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوای گەورە بە پێی توانا.**

---

**پ٧/ پێناسەی باوەڕ بوون بە خوای گەورە چییە؟**

و/ ئیمان بریتییە لە وەی کە بەزمان بووترێت و بەدڵ بیروباوەڕت پێی هەبێ و بە ئەندامەکانی لاشە کردەوەی پێ بکەیت، وە ئیمان بە چاکەکاری زۆر دەبێت و بە خراپەکاری کەم دەبێتەوە.وەك پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم فەرموویەتی:(( **الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنْ الطَّرِيقِ وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَانِ** )) ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

واتە: ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە گەورترین بەشی ئیمان ووتنی:( **لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ** ) یە وە بچوکترین بەشی ئیمان لابردنی شتێکی زیان بەخشە لەسەر ڕێگایەك وە شەرمکردن بەشێکە لە ئیمان.



**پ٨/ پایەکانی ئیمان چەندن و کامانەن؟**

و/ پایەکانی ئیمان شەش پایەن وەك پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم فەرموویەتی:(( ..... **أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ** ))

ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

**پایەکانی ئیمان بریتین لە مانەی خوارەوە:**

**١/ باوەڕ بوون بە خوای گەورە.**

**٢/ باوەڕ بوون بە فریشتەکان.**

**٣/ باوەڕ بوون بە کتێبەکان وەك :صوحوف و زەبوور وتەوڕات و ئینجیل وقورئان.**

**٤/ باوەڕ بوون بە هەموو پێغەمبەران سەلات وسەلامی خوایان لەسەر بێ.**

**٥/ باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوای.**

**٦/ باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەری خێر و شەڕ.**



**پ٩/ واتای ئیحسان چییە؟**

**و/ ئیحسان بریتیە: لە چڵەپۆپەی بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار وەك پێغەمبەر صلی اللہ علیەوسلم فەرموویەتی:(( أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ))** ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

**واتە: ئەمەندە بە دڵپاکی بەندایەتی بۆ پەروەردگارت بکەیت وەك ئەوەی کە پەروەردگار بەچاوەکانی خۆت ببینی خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت بێ گومان ئەو تۆ دەبینێت.**

**پ١٠/ تایبــەت مەندییــەكانی پــەیامی ئیســلام چــەندن و كامانەن؟**

**و/ پەیامی ئیسلام چەند تایبەت مەندییەكی لـە خـۆ گرتـوە وەك :**

**یەكەم/ پەیامی ئیسلام دوا هەمینی پەیامی خـوای گەورەیـە بۆ ئەهلی زەوی.**

**دوەم/ پــەیامی ئیسـلام نەسـخ كـەرەوەی هـەموو ئاینــەكانی پــێش خۆیــەتی و خــوای گــەورە هــیچ ئاینێــك لــە كــەس وەرناگرێت جگە لە ئیسلام.**

**سێیەم/ پەیامی ئیسلام تەواو ترینی پەیامە.**

**چـوارەم/ پـەیامی ئیسـلام گشـتگیرە بـۆ هـەموو ئـادەمیزاد و پەرییەكان بێ جیاوازی.**

**پێنجەم/ پەیامی ئیسلام گونجاوە بۆ هەموو كـات و شـوێنێك هەتا ڕۆژی دوای.**



## بنەمای سێهەم:

## ناسینی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

## من ڕازیم محمد صلى الله عليه وسلم پێغەمبەرم بێ

**پ١/ ناوی تەواوی ئەو پێغەمبەرە چییە کە خوای گەورە بۆی ناردوین؟**

**و/ ئەو پێغەمبەرەی کە خوای گەورە بۆی ناردوین ناوی محمدی کوڕی عبداللە ی کوڕی عبدالمتلبی کوڕی هاشمی قورەیشییە ـ سەلات و سەلامی لە سەر بێ ..**



**پ٢/ واتای (محمد رسول الله ) چییە؟**

**و/ واتای (محمد رسول الله ) بریتییە:**

**أ/ لە بەڕاست زانینی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە و هەواڵانەی کەپێی ڕاگەیاندوین.**

**ب/ گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی.**

**ج/ خۆش ویستنی لە هەموو کەس زیاتر.**

**د/ دوور کەوتنەوە لەو شتانەی کە لێی قەدەغە کردوین.**

**ه/بەندایەتی بۆ خوای گەورە بکەین لەسەر ئەو ڕێگەیەی کە پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم بۆی هێناوین.**



**پ٣/ ئایا پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم تەنها بۆعەرەب هاتووە؟**

**و/ نەخێر خوای گەورە پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم ی ناردووە بۆ هەموو ئادەمیزاد و پەرییەکان بە گشتی وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا....(١٥)﴾ سورەتی ئەعراف.**

**واتە:ئەی پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم بە خەڵکی ڕابگەیەنە و بڵێ: من نێردراوی خوای گەورەم بۆلای ئێوە بە گشتی.**



**پ٤/ پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم خەڵکی بۆ سەر چی بانگ دەکرد؟**

**و/ پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم خەڵکی بانگ دەکرد بۆ پەرستنی خوای گەورە و واز هێنان لە پەرستنی تاغوت و بتەکان وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ**

**أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ..( ٣٦ )﴾** سورەتی نەحل.

**واتە:بەڕاستی لە ناو هەموو نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە کە فەرمانیان پێ بکات بە پەرستنی خوای گەورە ودوور کەوتنەوە لە پەرستنی تاغوت وبتەکان.**



**پ٥/ پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم چەند ساڵ لە شاری مەکە بانگەوازی کرد و پاشان کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە و چەندیش لەوێ مایەوە؟**

**و/ پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم سیازدە ساڵ لە شاری مەکە بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ یەك خواپەرستی و پاشان کۆچی کرد بۆشاری مەدینە و دەساڵ لەوێ مایەوە، وەلە ماوەی ئەو دەساڵەدا فەرمانی کرد بە باقیمەنی حوکمەکانی تری ئیسلام وەك زەکات دان و ڕۆژووگرتن و حەجکردن و تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورە و پاشان لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا کۆچی دوای کرد.**

پ٦/ سزای ئەوانە چییە کە فەرمانەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه‌وسلم دەشکێنن؟

و/ ئەو کەسانەی فەرمانەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه‌وسلم دەشکێنن توشی تۆڵەی سەخت دەبن وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ **فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ** (٦٣)﴾ سورەتی نور.

واتە:ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه‌وسلم ئەو کەسانە بترسێنە کە پێچەوانەی فەرمانەکانی تۆ دەکەن، لە دونیادا توشی شەڕ و بەلاَ ببن یان لە دوارۆژدا توشی سزایەکی سەخت ببن. چونکە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر صلى الله عليه‌وسلم بە گوێڕایە ڵی کردنی خوای گەورە دادەنرێت.



پ٧/ پادشتی ئەوانە چییە کە گوێڕایەڵی دەکەن بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه‌وسلم ؟

و/ پاداشتیان بریتییە لە وەرگرتنی هیدایەت و دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست چونکە ئەم دوانە بەستراون بە گوێڕایەڵی

**کردنی پێغەمبەرەوە صلى الله عليەوسلم وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا......(٥٤)﴾ سورەتی نور.**

**واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بکەن ئەوا ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدات و هیدایەتیش وەردەگرن.**

**وەهەروەها ئەوانەی بەڕاستی گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم دە کەن دەچنە بەهەشتەوە وەك پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم فەرموویەتی :(( مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ... ))**

**ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.**



**پ٨/ ئایا لە سەرمان واجبە شوێنی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بکەوین؟**

**و/ بەڵێ لەسەرمان واجبە شوێنی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بکەوین و تەنها ئەو بە پێشەواو سەرمەشقی خۆمان بزانین وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ .....(٢١)﴾ سورەتی ئەحزاب.**

**واتــە: بەڕاســتی پێغەمبــەر صــلی الله علیەوســلم باشــترین سەرمەشقە بۆتان دەسا ئێـوەیش چاوی لـێ بکـەن و شـوێنی بکەون لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.**



**پ٩/ ئایا لەسەرمان واجبە خۆشەویستی پێغەمبـەر صـلی الله علیەوسلم پێش بخەین بەسـەر خۆشەویسـتی بـاوك ودایـك و هەموو خەڵکدا؟**

**و/ بەڵێ لەسەرمان واجبە خۆشەویسـتی پێغەمبـەر صـلی الله علیەوسلم پێش بخەین بەسـەر خۆشەویسـتی بـاوك ودایـك و هـەموو مرۆڤەکانیشـدا وەك پێغەمبـەر صـلی الله علیەوسـلم فەرموویەتی: ((لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَـدِهِ ، وَوَالِدِهِ ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)) ئیمامی بوخاری وموسلم گێڕاویانەتەوە.**

**واتە:ئیمانی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نابێت هەتاوەکو منی خۆشـتر نـەوێت لـە بـاوك و دایـك و منداڵـەکانی و هـەموو خەڵك بەگشتی.**

**شـایەنی باسـە خۆشەویسـتی پێغەمبـەر صـلی الله علیەوسـلم بەشوێن کەوتن و گوێڕایەڵی کردنی دەبێت نەك بە بانگەشە**

**کـردن بـۆ بیدعـه و شـته داهێنـراوەکـان و دوورکەوتنـەوە لـه سونەتەکانی .**



**پ١٠/ ئایـا لـه دوای پێغەمبـەر محمـد صـلی الله علیەوسـلم پێغەمبەرێکی تر دێت؟**

**و/ نەخێر له دوای پێغەمبەر محمد صلی الله علیەوسلم هیچ پێغەمبـەرێکی تـر نایـەت چـونکه ئـەو دواهـەمینی پێغەمبەرانـه - سـەلات وسـەلامیان لەسـەر بـێ - وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا (٤٠)﴾ سورەتی ئەحزاب.**

**واتە:بەڕاستی محمد باوکی هیچ یەکێك له ئێوه نییـه بـەڵکو پێغەمبەری خودایە و دواهـەمینی پێغەمبەرانیشـه سـەلات و سەلامیان لەسەر بێ بێگومان پـەروەردگار بـه هـەموو شـتێك زاناو ئاگادارە.**

---

**پ١١/ هەندێك لە تایبەت مەندییەكانی پێغەمبەری ئیسلام صلى الله علیەوسلم بژمێرە.**

**یەكەم/دواهەمینی پێغەرانە سەلات وسەلامیان لەسەر بێ بۆ سەر زەوی.**

**دووهەم/ خوای گەورە پشتگیری كردووە و سەری خستووە بە سەر نەیارانیدا.**

**سێهەم/ تەنها كەسێكە لە ڕۆژی دوایدا خوای گەورە مۆڵەتی دەداتێ كە تكا بكات بۆ دەست پێكردنی دادگایكردنی ئادەمیزاد و پەرییەكان بەمەش دەبێتە خاوەنی شەفاعەتی گەورە.**

**چوارهەم/ گەورە ترین و بەڕێزترین نێردراوی پەروەردگارە بۆ سەر زەوی .**

**پێنجەم/ ئومەتەكەشی بەڕێزترین ئومەتی سەر ڕوی زەمینن.**

**شەشەم/ خاوەنی پلەو پایەی وەسیلە و فەزیلەیە لە بەهەشتدا.**

---

# پایەکانی ئیمان

## پایەی یەکەم باوەڕبوون بە خودای پەروەردگار

**پ١/ واتای باوەڕ بوون بە خوای گەورە چییە؟**

**و/ بریتییە لە باوەڕ بوون بە زاتی پەروەردگار و هەموو بەشەکانی یەك خواپەرستی.**



**پ٢/ یەك خواپەرستی دەکرێت بە چەند بە شەوە؟**

**و/ یەك خواپەرستی دەکرێت بە سێ بەشەوە:**

**یەکەم/ تەوحیدی ڕوبووبییەت: بریتییە لە بەتەنها زانینی خوای گەورە لە کارەکانیدا وەك: دروستکردن و ڕۆزی دان و بەڕێوەبردنی بوونەوەر و شیفادانی نەخۆشەکان و زیندو کردنەوەی مردوەکان....**

**دوەم/ تەوحیدی ئولوهییەت: بریتییە لە بەتەنها پەرستنی خوای گەورە لە بەندایەتیدا وەك:پاڕانەوە و هاوارلێ کردن و پەنابۆبردن و پشت پێ بەستن و داوا لێ کردن و هیواپێ بوون...**

**سێهەم/ تەوحیدی ناوسیفەتەکان:بریتییە لە بڕوابوون بە هەموو ئەو ناو سیفەتانەی کە لە قورئان و سونەتدا هاتوون**

**بەو شێوەیەی کە خوای گەورە وەصفی خۆی پێکردووە یان پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم وەصفی خوای گەورەی پێکردووە لە سەر حەقیقەتی خۆی.**



**پ٣/ ئایا بێ باوەڕان نکوڵیان کردووە لە تەوحیدی ڕوبووبییەت؟**

**و/ نەخێر بێ باوەڕان هیچ نکوڵییەکیان لێ نەکردووە بەڵکو بەئاشکرا دانیان پیادا هێناوە وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەمەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە:**

**﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٣١)﴾**

**سورەتی یونس.**

**واتە: ئەی پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم بەبێ باوەڕان بڵێ: ئەوە کێ ڕۆزی ئێوە دەدات لە ئاسمانەکان و زەویدا ئەی ئەوە کێیە کە بیستن و بینینی بە ئێوە بەخشیوە ئەی ئەوە کێیە زیندو لە مردو دێنێتەدەرەوە و مردو لە زیندو دێنێتە دەرەوە ـ وەك دەرهێنانی گژوگیا و دانەوێڵە لە تۆوێکی وشك**

**و بە پێچەوانەیشەوە. وە ئەوە کێیە کە کارو باری بونـەوەر دەبات بە ڕێوە؟**

**بێ باوەڕان لەوەلاّمـدا دەلّێن : تـەنها خـوای گـەورە خـاوەنی ئـەم شـتانەیە،دەپێیـان بلّـێ:ئـیتر بـۆ لـە سـزای خـوای گـەورە ناترسن و هاوبەشی بۆ دادەنێن.**



**پ٤/ پوختەی تەوحیدی ڕوبووبییەت بریتییە لە چی؟**

**پوختەی تەوحیدی ڕوبووبییەت بریتییە لەمانەی خوارەوە:**

**أ/ تەنها خوای گەورە بەدیهێنەری بوونەوەرە.**

**ب/ تەنهاخوای گەورە بەڕێوەبەری کارو باری بوونەوەرە.**

**ج/ تـەنها خـوای گـەورە ژییەنـەر و مرێنـەری خـاوەن ڕۆحەکانە.**

**د/ تەنهاخوای گەورە خاوەنی خێر و شەڕ وقازانج و زەرەرە.**

**هـ/ تـەنهاخوای گـەورە مـانگ و خـۆر و ئەسـتێرەکانی ڕامکردوە لە ئاسماندا.**

**و/ تەنهاخوای گەورە لەئاسمانەوە بارانمان بۆدەبارێنێت.**

**س/ تەنها خوای گەورە ڕۆزی دەری درووستکراوەکانە.**

**کەواتە:خوایەك بە تەنها خاوەنی ئەم هەموو دەسەلأتە بێت و هیچ یارمەتی دەرێکی نەبێت لە درووستکردن و بەڕێوەبردنی بونەوەردا هەر ئەو شیاوی پەرستنە و پێویستە ئێمەش تەنها خۆمان بە موحتاجی ئەو بزانین و هەموو پێداویستییەکانمان هەر بۆلای ئەو بگێڕینەوە.**



**پ٥/ بەندایەتی بریتییە لە چی؟**

**و/ بەندایەتی بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە پێی خۆشە و پێی ڕازییە لە کار و کردەوە و گوفتاری مرۆڤەکان بە ئاشکرا بێت یان بە نهێنی.**



**پ٦/ جۆرەکانی بەندایەتی کامانەن؟**

**و/ جۆرەکانی بەندایەتی زۆرن وەك پاڕانەوە وداواکردن و ترسان و هیوابوون و پشت بەستن و متمانە بوون و نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن و زەکات دان و حەج و عومرەکردن ............تەنها بۆ خوای گەورە.**

**پ٧/ ئایا نزاکردن و پاڕانەوە بە عیبادەت دادەنرێت؟**

**و/ بەڵێ نزاکردن و پاڕانەوە بە عیبادەت دادەنرێت وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(( الدعاء هو العبادة )) صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب:( ١٦٢٧ ).**

**واتە: نزاو پاڕانەوە بەندایەتی و عیبادەتە.**



**پ٨/ ئایا درووستە داوا بکەین لە غەیری خوای گەورە؟**

**و/ نەخێر درووست نییە چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین تەنها داوا لەو بکەین و بەڵێنی وەڵامدانەوەشی پێداوین وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ.....( ٦٠ )﴾ سورەتی غافر.**

**واتە:پەروەردگاری ئێوە فەرموویەتی تەنها داوا لە من بکەن منیش دەست بە جێ وەڵامتان دەدەمەوە.**



**پ٩/ گومڕاترینی مرۆڤ کامانەن؟**

**و/ گومڕاترینی مرۆڤ ئەوانەن کە داوادەکەن و دەپاڕێنەوە لە غەیری خوای گەورە وەك پەروەدگار فەرموویەتی:﴿ وَمَنْ**

**أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ (٥)﴾** سورەتی ئەحقاف.

**واتـە:کـێ گـومڕاترە لـە وانـەی کـە هـاوار و هانـا دەبـەن بـۆ غەیری خوای گەورە لە وانەی کە ناتوانن وەڵامیـان بدەنـەوە هـەتا ڕۆژی دوای،وە هـەروەها داوا لـێ کـراوان بـێ ئاگـان لـە هاوار و نزای داواکاران.**



**پ١٠/ بۆچـی درووسـت نییـە هـاوار و هانـا ببـەین بۆغـەیری خوای پەروەردگار؟**

**و/ چونکە غەیری خوای گەورە هیچی بـە دەسـت نییـە وەك پەروەردگار فەرموویەتی**

**:﴿ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ (١٣) إِنْ تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ......(١٤)﴾** سورەتی فاتر.

**واتـە:بەڕاسـتی ئـەوانـەی کـە ئێـوە داوایـان لێدەکـەن و لێیـان دەپاڕێنـەوە جگـە لـە پـەروەردگار بـە ئەنـدازەی ئـەو پـەردە ناسـکەی دەوری ناوکـە خورمایـەك دەسـەڵاتیان نییـە، خـۆ**

ئەگەر ئێوە داوایان لێ بکەن ئەوان داواکەتان نایبیستن وە ئەگەر بیبیستن ناتوانن وەڵامتان بدەنەوە...



پ١١/ ئایا درووستە لە غەیری خوای گەورە بترسین؟

و/ نەخێر درووست نییە لە غەیری خوای گەورە بترسین وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿**فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ**.......(١٧٥)﴾ سورەتی ئالی عمران.

واتە: ئێوە لە شەیتان و دۆستەکانی شەیتان مەترسن تەنها لە من بترسن ئەگەر بڕواداران.



پ١٢/ ئایا درووستە پشت و پەنا بە غەیری خوای گەورە ببەستین؟

و/ نەخێر درووست نییە پشت و پەنا بە غەیری خوای گەورە ببەستین وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ **وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ** (٢٣)﴾ سورەتی مائیدە.

واتە: تەنها پشت و پەنا بەخوای گەورە ببەستن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

**پ ١٣/ ئایا درووستە جۆرێك لە جۆرەكانی بەندایەتی ئەنجام بدەین بۆ غەیری خوای گەورە؟**

**و/ نــە خێــر درووســت نییــە هــیچ جۆرێــك لــە جۆرەكــانی بەندایــەتی ئــەنجام بــدەین بــۆ جگــە لــە خــوای گــەورە، وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿إِيَّاكَ نَعْبُـدُ وَإِيَّــاكَ نَسْـتَعِينُ (٥)﴾ سورەتی فاتحە.**

**واتــە: ئــەی خوایــە تــەنها بەندایــەتی بــۆ تۆدەكــەین و داوای یارمەتیش هەر لە تۆدەكەین.**



**پ١٤/ كێ بە بەختەوەر دادەنرێت؟**

**و/ ئەوانە بە بەختەوەر دادەنرێن كە ئەم چوار سیفەتەیان تیادا كۆبببێتــەوە، وەك پــەروەردگار فەرموویــەتی:﴿ وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنْسَــانَ لَفِــي خُسْــرٍ (٢) إِلَّــا الَّــذِينَ آمَنُــوا وَعَمِلُــوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣)﴾سورەتی عەصر.**

**واتە:خــوای گــەورە ســوێندی خــواردوە بــە زەمــان كــە هــەموو مرۆڤــەكان لــە زیــان و زەرەردان جگــە لەوانــە نــەبێ كــە ١/ ئیمانێكی تەواویان هێناوە بە خوای پەروەردگار و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئاینی ئیسلام.**

**٢/ وەکردەوەی چاك ئەنجام دەدەن وەك نوێژ و ڕۆژ و زەكات و...**

**٣/ وەبانگی یەكتر دەكەن بۆ ئیمان وكردەوەی چاك.**

**٤/ وە ئامۆژگاری یەكتر دەكەن كە ئارامگرام بگرن لەسەر بەندایەتی پەروەردگار لە كاتی بەڵا و ناخۆشییەكان.**



**پ١٥/ واتای ( لا اله الا الله ) چییە؟**

**و/ واتای ( لا الــه الا الله ) بریتییە لە وەی كە هیچ پەرستراوێك نییە شیاوی پەرستن بێت بە حەق جگە لە زاتی خوای گەورە، وەك پەروەردگار فەرموویەتی:{ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ (٦٢)}**سورەتی حەج.

**واتە:بەڕاستی تەنها خوای گەورە حەقە و شیاوی پەرستنە، وە ئەو خواگەلەی كە موشریكەكان دەیان پەرستن پووچ و بەتاڵن و توانای هیچ شتێكیان نییە.**

**پ١٦/ پایەکانی ( لااله الا الله ) چەندن؟**

**و/ پایەکانی ( لااله الا الله ) دوانن :**

**یەکەم/ نەفی کردنی خوایەتییە لە غەیری خوای گەورە.**

**دووهەم/ چەسپاندنی خوایەتییە تەنها بۆ خوای گەورە.**



**پ١٧/ مەرجەکانی(لااله الا الله) چەندن و کامانەن؟**

**و/ مەرجەکانی (لااله الا الله ) لە حەوت مەرج پێکهاتووە کە بریتیین لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم/ العلم : واتە: شارەزابوون و تێگەیشتن لە واتای (لااله الا الله).**

**دوەم/ الیقین: واتە: دڵنیابوون لە ڕاستێتی پەرستنی خوای گەورە بەبێ دوودڵی و گومان.**

**سێیەم/ القبول: واتە: وەرگرتنی یەك خواپەرستی و ڕەدنەکردنەوەی.**

**چوارەم/ الانقیاد: واتە:ملکەچ بوون بۆ یەك خواپەرستی و پشت هەڵنەکردن.**

**پێنجەم/ الصدق: ووتنی ئەم ووشەیە بەڕاستی لە ناو دڵدا و بەدرۆ نەخستنەوەی.**

**شەشەم/ الاخلاص: بەپاك ڕاگرتنی كردەوەكان لە خەوش وخاڵی هاوبەش دانان.**

**حەوتەم/ خۆشەویستی بۆ ئەم ووشەیە و هەرگیس ڕقت لێی نەبێتەوە.**

**یەك خواپەرستان تەواوی خۆشەویستییان بۆ خوای گەورە هەیە بەڵام هاوبەش دانەران لە گەڵ خوای گەورە خۆشەویسییان بۆ پەرستراوەكانی تریش هەیە.**



**پ١٨/ پایەكانی بەندایەتی چەندن و كامانەن؟**

**و/ ئەو بەندایەتییەی كە خوای گەورە فەرمانی پێكردووە لە سەر سێ پایە بەندە كە ئەمانەن:**

**یەكەم:تەواى ترس و بیم لە خوای گەورە.**

**دوەم:تەواوی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە.**

**سێهەم:تەواوی مل كەچی بۆ خوای گەورە.**

**پ١٩/ ئایـــا پـــەروەردگار بەندایـــەتی و عیبـــادەتی کـــەس وەردەگرێت بەبێ یەك خواپەرستی؟**

**و/ نەخێر خوای گەورە بەندایەتی هیچ کەسێك وەرناگرێت ئەگەر تەوحید و یەك خواپەرستی لە گەڵدا نەبێت وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿...لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٦٥)﴾سورەتی زومەر.**

**واتە:ئەگەر تۆ هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت و بەندایەتی بۆ جگە لە و ئەنجام بدەیت ئەوە هەموو کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە و دەبیتە یەکێك لە زیان لێ کەوتوان.**



**پ٢٠/ مەرجەکانی وەرگیرانی بەندایەتی چەندن و کامانەن؟**

**و/ مەرجەکانی وەرگیڕانی بەندایەتی دوانن کە بریتین لە مانەی خوارەوە:**

**یەکەم:پەرستی خوای گەورە بە ئیخلاصەوە.**

**دووهەم:پەرستنی خوای گەورە لە سەر ئەو ڕێگایەی کە پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم پێی هاتوە.**

**پ٢١/ هاوبەش بۆ خوادانان دەكرێت بە چەند بەشەوە و کامانەن؟**

**و/ هاوبەش بۆ خوادانان دەكرێت  بە دوو بەشەوە:**

**یەکەم: هاوبەش دانی گەورەیە كە بریتییە لە ئەنجامدانی جۆرێك لە جۆرەكانی بەندایەتی بۆ جگە لە پەروەردگار وەك : داواكردن و پاڕانەوە و پشت بەستن و ترسان و نوێژكردن و حەیوان سەربڕین و تەواف كردن و نەزركردن....**

**دووهەم: هاوبەش دانانی بچوك كە بریتییە: لە هەر ووتە و كردەوەیەك ڕێ خۆش كەر بێت بۆ هاوبەش دانانی گەورە وەك : نوێژكردن لە نزیك گۆڕەكان و كەمێك لە ڕوپامایی كردن و سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە.**



**چەند تێ بینییەك:**

**یەك/ نوێژكردن لە سەر گۆڕەكان درووست نییە و حەرامە چونكە سەردەكێشێت  بۆ پاڕانەوە و داواكردن لە گۆڕەكان ئەمەش بە شیركی گەورە دادەنرێت.**

دوو/ ڕووپامایی کردن درووست نییە و حەرامە چونکە سەردەکێشێت بۆ کەوتنە ناو ڕوپامایی کردنی گەورە ئەمەش بە شیرکی گەورە دادەنرێت.

سیٚ/ سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە درووست نییە و حەرامە چونکە هۆکارە بۆ بەشکۆ زانینی غەیری خوای گەورە ئەمەش بە شیرکی گەورە دادەنرێت.



پ٢٢/ سودەکانی بڕوابوون بە خوای گەوەرە؟

بڕوابوون بە خوای گەورە کۆمەڵێك سودی دەبێت لە دونیا و دوارۆژدا وەك:

أ/ پاراستنی بڕواداران لە ناخۆشی و بەڵاکانی دونیا و ڕزگارکردنیان لە پلانی دوژمنان وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ **إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا...(٣٨)**﴾ سورەتی حەج.

واتە: بەڕاستی خوای گەورە پارێزگاری لە بڕواداران دەکات.

ب/ ئاسودەیی و کامەرانی دەستەبەر دەکات بۆ بڕواداران لە دونیا و دوارۆژدا وەك پەروەردگار فەرمویەتی:﴿ **مَنْ عَمِلَ**

صَـــالِحًا مِـــنْ ذَكَـــرٍ أَوْ أُنْثَـــى وَهُـــوَ مُـــؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّـــهُ حَيَـــاةً طَيِّبَةً.....( ٩٨)﴾ سورەتی نەحل.

واتە: هەرکەسێك کردەوەیەکی باش ئەنجام بدات چ پیاو بێ یان ژن مادام بڕوا دار بێت ژیانێکی پڕ ئاسوودەیی و خۆشی پێ دەبەخشین......

ج/ بڕوا هێنان بەخوای گەورە بیرو باوەڕی موسڵمان پاك دەکاتەوە لە خورافات و شەخس پەرستی و دڵەکان ئەبەستێتەوە بە خوای گەورەوە و ڕزگار دەبن لە بەندایەتی بەندەکان و دەبنە بەندەی ڕاسالّی پەروەردگار.

د/ گەورەترین سوودی بڕواهێنان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار و چونە ناو بەهەشتەکەیەتی.



پ٢٣/ ئەوشتانە چین کە دژی یەك خواپەرستین؟

و/ ئەوشتانەی کە دژی یەك خواپەرستین دەکرێن بە سێ بەشەوە:

یەك/ بێ باوەڕبوون :بریتییە لە چەند ووتە و کردەوەیەك کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەباتە دەرەوە وەك: جوێن دان و گاڵتەکردن بە خوای گەورە یان بە قورئانی پیرۆز یان بە

پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم وەك پەروەردگار فەرمویەتی:﴿... **قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ**.....(٦٦)﴾ سورەتی تەوبە.

واتە: پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئایا ئێوە بە خوای گەورە و ئایەتەكانی و پێغەمبەرەكەی صلى الله عليه وسلم گاڵتە دەكەن، ئیتر پاساو مەهێننەوە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕبوون لە دوای ئەوەی ئیمانتان هێنا.

دوو/ هاوبەش دانان :بریتییە لە ئەنجام دانی جۆرێك لە جۆرەكانی بەندایەتی بۆ جگە لە خوای گەورە وەك داواكردن و پاڕانەوە و پشت بەستن و سوژدە بردن.... وە هەرگیس خوای گەورە لە خاوەنەكەی خۆش نابێت وەك پەروەردگار فەرمویەتی:﴿ **إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ**.....(٤٨)﴾سورەتی نیساء.

واتە: بێگومان خوای گەورە لە وانە خۆش نابێت كە هاوبەشی بۆ دادەنێن...

سـێ/ دووڕوی: بریتییـە لـەوەی کـە بـە ڕواڵـەت و زمـان وای نیشان دەدات کە موسڵمان و بڕوادارە بـەڵام لـە ڕاسـتیدا دڵـی پڕە لە کوفر و بێ باوەڕی وەك پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨)﴾ سورەتی بەقەرە.

واتە: هەنـدێك لـە خـەڵك ئـەڵێن بڕوامـان هێنـاوە بـە خـوای گـەورە و ڕۆژی دوای بـەڵام بەڕاسـتی ئەوانـە هـەر بـڕوادار نەبون.



## پایەی دووهەم باوەڕبوون بەفریشتەکان

پ١/ واتای بڕوابوون بە فریشتەکان چییە؟

و/ بڕوابوون بە فریشتەکان بریتییە لە بڕواهێنان بە بوونی فریشتەکان کە ئەوانیش دروستکراوی پەروەردگارن و بە هیچ شێوەیەك لە فەرمانەکانی خوای گەورە لانادەن: ﴿.....بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ - لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ (٢٧)﴾ سورەتی ئەنبیا.

واتە: فریشتەکان کۆمەڵە دروستکراوێکی ڕێزلێگیراون و پێش فەرمانەکانی پەروەردگار ناکەون و ئەوان دەست بەجێ فەرمانەکانی پەروەردگار جێ بەجێ دەکەن.



پ٢/ فریشتەکان چەند جۆرن و چ کارێکیان پێ سپێردراوە؟

و/ فریشتەکان چەند جۆرێکن و هەریەکەیان کارێکی تایبەتی پێ سپێردراوە بەم شێوەیە:

یەکەم: جوبرەئیل سلامی خوای لە سەر بێ کە سەرداری فریشتەکانە هێنانی وەحی پێ سپێردراوە بۆ پێغەمبەران سەلات وسەلامی خوایان لە سەر بێ.

**دووهەم: ئیسرافیل سلامی خوای لە سەر بێ فووکردنی بە کەڕەنادا پێ سپێردراوە.**

**سێهەم: فریشتەی ڕۆح کێشان سلامی خوای لە سەر بێ کەڕۆح کێشانی پێ سپێردراوە.**

**چوارەم:ئەو فریشتانەی کە باران و سەوزبوونی ڕوەك وکژوگیایان پێ سپێردراوە.**

**پێنجەم: ئەو فریشتانەی کە پاراستنی کارو کردەوەی بەندەکانیان پێ سپێردراوە.**

**شەشەم: ئەو فریشتانەی کە پاراستنی جەستەو لاشەی مرۆڤەکانیان پێ سپێردراوە بە گشتی مەگەر لە شتێك نەبێت کە خوای گەورە ویستی لە سەر بێت.**

**حەوتەم: ئەو فریشتانەی کە بەڕێوەبەری بەهەشت و دۆزەخن.**

**هەشتەم: ئەو فریشتانەی کە بە شوێن کۆڕی زانستی شەرعی و یادی خوای گەورەدا دەگەڕێن.**

**نۆهـەم: ئـەو فریشـتانەی کـە بـە هەمیشـەیی لـە ڕوکـووع و سجوودان بۆ خوای گەورە و هەموو ئاسمانەکانیان تەندووە و کەس ژمارەیان نازانێت مەگەر زاتی پەروەردگار نەبێت.**

**دەهـەم/ ئـەو فریشـتانەی کـە دۆعـاو نـزای خێـر دەکـەن بـۆ موسڵمانان.**

**یازدەهەم/ ئەو فریشـتانەی کـە پرسـیاری نـاو گـۆڕ دەکـەن و ناویان مونکەر و نەکیرە.**



**پ٣/ بڕوابوون بە فریشتەکان چ شوێنەوارێك لەسـەر ئیمـانی موسڵمانان درووست دەکات؟**

**و/ بـڕوا بـوون بـە فریشـتەکان چـەند شـوێنەوارێك بـە جـێ دێڵێت لەوانە:**

**أ/ وەرگرتنــی ئیســتیقامە لەســەر بەندایــەتی پــەروەردگار چـونکە ئـەو کەسـەی بـڕوای بـە وە هـەبێت کـە فریشـتەکان کردەوەکانی دەنوسن ئەوا ناچار دەبێت خۆی لـە خراپـەکاری بپارێزێت.**

---

**ب/ هەستکردن بە ئارامی کاتێك موسڵمانان دەزانن لەم بونەوەرەدا چەندەها فریشتەی تیادایە و هەندێکیان پارێزگاری لە وان دەکەن .**

**ج/ دڵ خۆشی بڕواداران کاتێك دەزانن ئەوان بەتەنها نین لە بەندایەتی کردنی پەروەردگار و سووژدە بۆ بردنی.**



# پایەی سێیەم باوەڕبوون بەکتێبەکان

**پ١/ واتای بڕوابوون بە کتێبەکان چییە؟**

**و/ بریتییە لە بڕوابوون بە هەموو ئەو کتێبانەی کە خوای گەورە ناردوویەتییە خوارەوە بۆ پێغەمبەران سەلات و سەلامی خوایان لە سەر بێ،وە هەموویان بە کلامی خوای گەورە دادەنرێن وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ......(١٣٦)﴾سورەتی نیساء.**

**واتە:ئەی باوەڕداران باوەڕتان تازە بکەنەوە بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی صلى الله علیەوسلم وە بەو کتێبەش کە بۆی هاتووەتە خوارەوە،وە بەو کتێبانەش کە پێشتر بۆ پێغەمبەران هاتوونەتە خوارەوە سەلات و سەلامی خوایان لە سەر بێ.**



**پ٢/ ئەو کتێبانەی کە بۆ پێغەمبەران هاتوون سەلات و سەلامی خوایان لە سەر بێ چەندن و کامانەن؟**

**و/ ئەو کتێبانەی کە ناویان هاتووە تەنها پێنجن و بریتیین لە قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زەبوور و صوحوف.**

**پ٣/ ئـەو پێغەمبەرانــە کامانــەن کـە ئـەم کتێبانــەیان بــۆ هاتووە؟**

**و/ بریتین لەم پێغەمبەرانە سەلات و سـەلامیان لەسـەر بێ:**

**یەکـەم: ابڕاهیمـی خـەلیل علیـە السـلام کـە صـوحوفی بـۆ هاتووەتە خوارەوە.**

**دوەم: پێغەمبەر موسا علیه السلام کە تەوڕاتی بـۆ هاتووەتـە خوارەوە.**

**سـێیەم: پێغەمبــەر داود علیــە السـلام کــە زەبــووری بــۆ هاتووەتە خوارەوە.**

**چـوارەم: پێغەمبــەر عیسـا علیــە السـلام کــە ئینجیـل بــۆ هاتووەتە خوارەوە.**

**پێنجەم: پێغەمبەر محمد صلی الله علیـە وسـلم کـە قورئـانی پیرۆزی بۆ هاتووەتە خوارەوە.**



**پ٤/ تایبەت مەندییەکانی قورئانی پیرۆز کامانەن؟**

**و/ قورئــانی پــیرۆز چــەند تایبــەت مەندییــەکی تیــادا کۆبووەتەوە کە لە هیچ کتێبێکی تردا کۆنەبووەتەوە وەك:**

یەکـەم:قورئـانی پـیرۆز پووختـەی حـوکمی شـەریعەتەکانی پێشووی تیادا کۆبووەتەوە.

دووهەم: قورئانی پیرۆز پشتگیری لەو ڕاستیانە دەکات کەلـە کتێبـەکانی پێشـوودا هـاتوون لـە باسـی یـەك خواپەرسـتی و دوورەپـــــەرێزی لـــــە هاوبـــــەش دانـــــان وەك پەروەدگارفەرموویـەتی :﴿وَأَنْزَلْنَـا إِلَيْـكَ الْكِتَـابَ بِـالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَـيْنَ يَدَيْـهِ مِـنَ الْكِتَـابِ وَمُهَيْمِنًـا عَلَيْـهِ.....(٤٨)﴾ سورەتی مائیدە.

واتــە:بێگومــان ئــەی پێغەمبــەر صــلی اللە علیەوســلم ئــەم قورئانەمان بەڕاستی بۆ تۆ ناردووەتە خوارەوە پشتگیری لەو ڕاستیانە دەکـات کەلـە کتێبـەکانی پێشوودا هـاتووە و ڕۆشـن کـەرەوەی ئـەو حوکمانەیـە کـە دەسـتکاری کراوە لەلایـەن گـاوور و جوەکانــەوە . وە نەسـخ کـەرەوەی هەنـدێك لــە حوکمەکانیەتی.

سێیەم: واجبە لەسەر هەموو مرۆڤەکان دەست بە قورئانەوە بگرن و گوێڕایەڵی بکەن بـەڵام کتێبـەکانی پێشوو تـەنها بـۆ گــەلێکی تایبــەت هاتووەتــە خــوارەوە، وەك پــەروەردگار

فەرموویـەتی:﴿**وَأُوحِـيَ إِلَـيَّ هَـذَا الْقُـرْآنُ لِأُنْـذِرَكُمْ بِـهِ وَمَـنْ بَلَغَ....(١٩)**﴾ سورەتی ئەنعام.

واتە:من ئەم قورئانەم لەلایەن پـەروەردگارەوە بـۆ هـاتوە بـۆ ئــەوەی ئێــوەی پــێ بترســێنم و هــەروەها هــەموو ئــەو میللەتانەی تریش کە ئەم قورئانەیان پێ دەگات.

چــوارەم:پــەروەردگار بــەڵێنی داوە کــە قورئــانی پــیرۆز بپارێزێت لە دەستێ وەردان و گۆڕانکاری وەك خـوای گـەورە فەرمویەتی:﴿ **إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَـهُ لَحَـافِظُونَ (٩)**﴾ سورەتی حیجر.

واتــە: ئێمــە ئــەم قورئانــەمان ناردووەتــە خــوارەوە و هــەر ئێمەش دەیپارێزین.



پ٥/ قورئانی پیرۆز چەند مافی لەسەرمان هەیە و کامانەن؟

و/ قورئـانی پـیرۆز چـەند مـافێکی لـە سـەرمان هەیـە کـە بـریتین لەمانە:

یەکـەم:لـە سـەرمان پێویسـتە کـە قورئـانی پیرۆزمـان خـۆش بوێت و بەچاوی شکۆ و گەورەییەوە سـەیری بکـەین چـونکە کەلامی پەروەردگارە و ڕاست ترین و جوان ترین ووتەیە.

**دووهەم: لەسەرمان پێویستە کە قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە و هەوڵ بدەین لە واتاکەی تێ بگەین و بیربکەینەوە لە حوکم و ئاداب و ئامۆژگاری و چیرۆکەکانی.**

**سێهەم: لەسەرمان پێویستە کە ئاکار و ڕەوشت و هەڵسوکەوتمان بە گوێرەی قورئانی پیرۆز بێت و فەرمانەکانی جێ بە جێ بکەین و خۆمان لە قەدەغەکراوەکانی بپارێزین.**



**پ٦/ ئایا تەورات و ئینجیل دەستکاری کراوە؟**

**و/ بەڵێ جوولەکە و گاوورەکان دەستکاری تەورات و ئینجیل یان کرد و حوکمەکانی پەروەردگاریان گۆڕی هەر بۆیە خوای گەورە سزای دان و نەفرەتی بەسەردا باراندن وەك پەروەردگار فەرموویەتی:**

﴿ **مِنَ الَّذِينَ هَادُوا يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ**...(٤٦)﴾ سورەتی نیساء.

**واتە: دەستەیەك لە جوولەکەکان دەستکاری تەوراتیان کردو حوکمەکانیان گۆڕی.**

**پ٧/ ئایا ئەو کتێبانەی پێش قورئانی پیرۆز دابەزیون درووستە کاریان پێ بکرێت؟**

**و/ نە خێر درووست نییە لە پاش دابەزینی قورئانی پیرۆز کار بە هیچ کتێبێکی تری ئاسمانی بکرێت چونکە هەموویان نەسخ بونەتەوە بە قورئانی پیرۆز.**



**پ٨/ ئایا درووستە تەنها کار بە قورئانی پیرۆز بکەین و دەست لە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم بەربدەین؟**

**و/ نەخێر درووست نییە لەبەر ئەم چەند هۆکارەی خوارەوە :**

**أ/ چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی پێکردوین ناکۆکییەکان بگێڕینەوە بۆ لای پەروەردگار و پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وەك پەروەردگار فەرموویەتی:**

**﴿ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ..... (٥٩) ﴾** سورەتی نیساء.

ئاشكرایە مەبەست گێڕانەوەیەتی بۆلای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم

ب/ خوای گەورە گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم ی گرێ داوەتەوە بە گوێڕایەڵی خۆیەوە، وەك فەرموویەتی:{ **مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ**( ٨٠) } سورەتی نیساء.

واتە: ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم بكات بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای گەورەی كردووە.ئاشكرایە گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم وەرگرتن و كارپێكردنی فەرموودەكانیەتی.



ج/ سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بە وەحی دادەنرێت وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:{**وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى** ( ٣ ) **إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى** ( ٤ )}سورەتی نەجم.

واتە:پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بە هەوای نەفسی خۆی قسەناكات بەڵكو بە نیگاهی پەروەردگار دەدوێت.

د/ سوننەتەكانی پێغەمبەر صلى الله عليە وسلم بە ڕوونكەرەوەی قورئانی پیرۆزە دادەنرێت وەك خوای گەورە

فەرموویەتی: {**وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (٤٤)**} سورەتی نەحل.

**واتە: ئێمە بۆیە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردوەتەوە خوارەوە ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆئەوەی ڕوونی بکەیتەوە ئەوەی کە لای خواوە هاتوە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە بەڵکو ئەو خەڵکە لێی وورد ببنەوە وبیری لێ بکەنەوە.**



**پ٩/ئایا ڕوونکردنەوەی قورئان دەکرێت بە چەند بەشەوە؟**

**و/ ڕوونکردنەوەی قورئان دەکرێت بە دوو بەشەوە:**

**یەکەم/ گەیاندنی ڕستەو ووشەکانی قورئانی پیرۆزە وەك خۆی بە بێ کەم و کورتی،ئەمەش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەجوانی پێی هەستاوە، وەك خوای گەورە شایەتی بۆ داوەو فەرموویەتی:{ وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ (٢٤)}** سورەتی تەکویر.

**واتە: پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بەخیلی نەکردووە لە گەیاندنی قورئانی پیرۆز و فێرکردنی یارانی.بەڵکو بەتەواوی بەخەڵکی گەیاندووە.**

دووهەم/ گەیاندن و ڕوونكردنەوەی واتای قورئان ئەمەش بەقەول وفعل وتەقریردەبێت وەك ڕوونكردنەوەی ڕستە موجمەلەكان و موقەید كردنی موتڵەقەكان و تەخسیسكردنی عامەكان و.......وەك خوای گەورە فەرموویەتی:{ **وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٣٨**)) سورەتی مائدە.

واتە: دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لەپاداشتی كاری ناڕەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەكە لەلایەن پەروەردگارەوە،خوای گەورە فەرمان ڕەواو كاربەجێیە.

دەبینین ووشەی (**السارق**) لەگەڵ (**ايديهما**) هەر دووكیان بە موتڵەقی هاتوون، بەڵام لە فەرمودەدا هاتووە كە هەردووكیان موقەییەد كراون یەكەمیان بەڕوبعە دینارێك وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:((**لا قطع الا في ربع دينار فصاعدا**)) **متفق عليه**.

واتە: دەستی هیچ دزێك نابڕدرێت مەگەر ڕوبعە دینارێكی ئاڵتون یان لەوە زیاتری دزیبێت .

**پاشان دوەمیان ووشەی ( ایدیهما ) پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم شوێنی دەستبڕینەکەی موقەیدکردووە بە مەچەکەوە هەموو دەست و باڵی کابرای دز نابڕدرێت.**

**کەواتە: بەبێ گەڕانەوە بۆ فەرموودەکان ناتوانین وەك ئەوەی خوای گەورە دەیەوێ حوکمەکان جێبەجێ بکەین.**



**پ١٠/ ئایا چۆنێتی جێ بە جێ کردنی نوێژ لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونکراوەتەوە؟**

**و/ نەخێر لە قورئانی پیرۆزدا بە کورتی فەرمانی پێ کراوە و لە سوننەتەکانی پێغەمبەردا صلى الله علیهوسلم ڕوونکراوەتەوە، وەك پێغەمبەر صلى الله علیهوسلم فەرموویەتی: :(( صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي )) ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.**

**واتە:نوێژ بکەن وەك چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم.**

**پاشان زیاتر لە هەزار فەرموودە لە سەر چۆنێتی نوێژکردن هاتووە کە ژمارەی ڕکاتەکان و چۆنێتی ڕوکووع و سوجود و تەحیات و خوێندنی زیکرەکان و سلاودانەوە و.....دیاری دەکات خۆ ئەمانە هیچی لە قورئاندا نەهاتووە.**

**پ١١/ ئایا شێوازی ئەنجامدانی حەج و عومرە و چۆنێتی زەکات دان لە قورئانی پیرۆزدا ڕوون کراوەتەوە؟**

**و/ نەخێر شێوازی حەج و عومرەکردن و چۆنێتی زەکات دان و ئەندازە و ژمارەی ئەو شتانەی کە زەکاتی لێ دەدرێت دیسان هیچی لە قورئاندا نەهاتووە هەموو ئەمانە لە فەرموودەکاندا هاتوون وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە کاتی حەجی ماڵ ئاوایدا فەرموی:(( لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ ))**ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

**واتە:ئێوە چۆنێتی جێ بە جێ کردنی بەندایەتی حەج لە من وەربگرن بەڕاستی من نازانم لەوانەیە من لە دوای ئەم حەجە ئیتر حەجی تر نەکەم.**



**پ١٢/ ئایا لە سەرمان واجبە کە دەست بە قورئان و سوننەتەوە بگرین ؟**

**و/ بەڵێ لەسەرمان واجبە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(( تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي، وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ ))**صحيح الجامع(٢٩٣٧ ).

واتە:دوو شتم لە ناو ئێوەدا بەجێ هێشتوە ئەگەر دەستیان پێوەبگرن گومڕانابن، یەکەمیان :کتێبەکەی خوای گەورەیە و دووهەمیشیان سوننەتەکانی منە، ئەم دوانە لە یەکتر جیانابنەوە هەتا وەکو سەر حەوزی کەوسەر.



پ١٣/ ئایا مەبەست چییە لەم ڕستەیە کە دەڵێت : (( **وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ** ))؟

و/ دوو مەبەستی تیادایە:

یەکەم/ کارکردن بە قورئان وسوننەت بەردەوام دەبێت هەتا ڕۆژی دوای.

دووهەم/ ئەم دوو سەرچاوەیە لە یەکتر جیانابنەوە هەتا ڕۆژی دوای.



# پایەی چوارەم باوەڕبوون بە پێغەمبەران

# باوەڕبوون بە ـ پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لە سەر بێ

پ١/ واتای بڕوابوون بە پێغەمبەران چییە سەلات و سەلامی خوایان لێ بێ؟

و/ بڕوابونە بەوەی کە خوای گەورە بۆ هەموو نەتوەیەك پێغەمبەری ناردووە کە بانگیان بکات بۆ یەك خواپەرستی و بیان ترسێنێت لە هاوبەشدان، وە هەموویان ڕاستگۆ و دەست پاك و لە خواترس بوون و ڕێ نیشان دەری چاکی گەلەکەیان بوون و بانگەوازی حەقیان بە بێ زیاد و کەم پێ گەیاندوون وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿**وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ( ٣٦)**﴾ سورەتی نەحل.

واتە:بە دڵنیاییەوە لە ناو هەموو نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی تەنها بەندایەتی بۆ خوای گەورە بکەن و دوور کەونەوە لە تاغوتەکان.

**پ٢/ ئایا مرۆڤەكان پێویستیان بە پەیامی پێغەمبەران هەبوە سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ؟**

**و/ بە ڵێ مرۆڤەكان لە خواردن و خواردنەوە زیاتر پێویستیان بە پەیامی پێغەمبەران هەیە - سەلات و سەلامیان لە سەر بێ - چونكە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ناسینەوەی حەڵاڵ و حەرام و جیاكردنەوەی شتە پیسەكان لە پاكەكان و هەروەها بەدەستهێنانی بە ختەوەری دونیا و دوا ڕۆژ جگە لە ڕێگەی پێغەمبەران نەبێ - سەلات و سەلامیان لە سەر بێ -.**



**پ٣/ ئایا لەسەرمان واجبە بڕوامان بە هەموو پێغەمبەران هەبێ سەلات و سەلامیان لە سەر بێ؟**

**و/ بەڵێ لەسەر مان واجبە و هیچ كەسێكیش باوەڕی دانامەزرێت هەتا بڕوای بەتەواوی پێغەمبەران نەبێ سەلات و سەلامیان لە سەر بێ وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ....(٢٨٥)﴾** سورەتی بەقەرە.

**واتــە: پێغەمبــەر صــلى الله علیەوســلم بــڕوای هێنــاوە بــەو قورئانــەی كــە بــۆی ڕەوانــە كــراوە و هــەروەها بــڕوادارانیش، هەموویشیان باوەڕیان هێناوە بە خوای گەورە و فریشتەكان و كتێبەكان و ـ پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لە سەر بێ ـ**



**پ٤/ ئایا ـ پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لـە سـەر بـێ ـ بـێ لە ڕەگەزی ئادەمیزادن؟**

**و/ بەڵێ ـ پێغەمبەران سـەلات و سـەلامیان لـە سـەر بـێ ـ لـە ڕەگەزی ئادەمیزادن وەك پـەروەردگار فـەرمانیان پـێ دەكـات كە بە خەڵك ڕابگەیـەنن:﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ....(١١٠) ﴾سورەتی كەهف.**

**واتــە: ئــەی پێغەمبــەر صــلى الله علیــە وســلم پێیــان بڵــێ بەڕاستی منیش مرۆڤێكم وەك ئێوە تەنها جیاوازیم ئەوەیـە كە خوای گەورە منی هەڵبژاردووە و نیگاهی بـۆ نـاردووم كـە پەرستراوی ئێوە تەنها یەك خوای تاك و تەنهایە.**



**پ٥/ ئایا ـ پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لـە سـەر بـێ ـ پـێ ویستیان بەخواردن و خواردنەوە هەبووە؟**

و/ بەڵێ ـ پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لە سەر بێ ـ لە ڕەگەزی ئادەمیزادن و وەك ئەوانیش پێ ویستیان بە خواردن و خواردنەوە هەیە و دووچاری خۆشی و ناخۆشی و مردن دەبن وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿**وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ..(٢٠)** ﴾ سورەتی فورقان.

واتە:ئێمە پێش تۆ هیچ کەسێکمان نە ناردووە بە پێغەمبەر ئیلا ئەوان خواردن و خواردنەوەیان دەخوارد و بە بازاڕدا دەڕۆیشتن.



پ٦/ ئایا پێغەمبەران سەلات و سەلامیان لە سەر بێ خێر و شەڕیان بەدەست بووە ؟

و/ نەخێر ئەوانیش مرۆڤن و کاریان تەنها گەیاندنی پەیامی خوای گەورە بووە بە مرۆڤەکان وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ **قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (١٨٨)**﴾ سورەتی ئەعراف.

**واتە: ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێ یان بڵێ کە مـن ناتوانم خێر و خۆشی بۆخۆم بەدەست خەم وە ناشتوانم زیـان و زەرەر لـە خـۆم دوور خەمـەوە مەگـەر شـتێك خـوای گەورە بییەوێت خۆ ئەگەر من عیلمی غـەیبم بزانیایـە ئـەو ڕیگایانـەم دەگرتـە بـەر کـە هەرچی خێـر و خۆشـی هەیـە بۆخۆم بە دەستم دەهێنـا و دووچاری ناڕەحـەتی نـەدەبووم، مــن تــەنها ترســێنەر و مــژدەدەرم بــۆ خــەڵکانێك کــە بڕوابێنن.**



**پ٧/ ئایـا خـوای پـەروەردگار یارمـەتی پێغەمبـەرانی داوە ـ ســەلات و ســەلامیان لــە ســەر بــێ ـ بــۆ سەرخســتنی بانگەوازەکەیان؟**

**و/ بەڵێ خوای گەورە کۆمەڵێك مـوعجیزەی بـە پێغەمبـەران بەخشیوە ـ سەلات و سـەلامیان لـە سـەر بـێ ـ بـۆ ئـەوەی کـە بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەوان بێـت بـە دەستیانەوە و دەم کـوتی بـێ بـاوەڕانی پـێ بکـەن وەك کۆچـانەکەی پێغەمبـەر موسـا علیـە الســلام و چــاککردنەوەی نەخۆشــەکان و زینــدووکرد نەوەی مردوەکان لەلایەن پێغەمبەر عیساوە علیـە السلام و**

**لـەت کردنـی مـانگ لـە لایـەن پێغەمبـەر محمـدەوە صلى الله عليه وسلم.**



**پ٨/ چ مافێکمـان لەسـەر واجبـە ئـەنجامی بـدەین بەرامبـەر پێغەمبەران ـ سەلات و سەلامیان لە سەر بێ ـ؟**

**و/ چەند شتێکمان لەسەر واجبە لەوانە:**

**أ/ بڕوابوون بەوەی کـە هـەموویان لـە لایـەن پـەروەردگارەوە ڕەوانــە کــراون بەمەبەســتی گەیانــدنی پــەیامی تەوحیــد و یەکخواپەرستی.**

**ب/ دەر بڕینی خۆشەویستی بۆ هەموویان .**



**ج/ بڕوامان وابێ کە هیچ کەسێك ناگاتە پلـەو پایـەی ئـەوان بــە ڕاســتگۆیان و شــەهیدەکان و پیــاو چاکانیشــەوە،چــونکە ئـەوان پـەیام بـەر و هەڵبـژێردراوی پـەروەردگارن لـە نێـوان مرۆڤەکاندا.**

**د/ بڕوامـان وابـێ کـە پێغەمبـەران ـ سـەلات و سـەلامیان لـە سـەر بـێ ـ هـەموویان لـە ئاسـتێکدا نـین بـە ڵکو هەنـدێکیان لەوانی تر پایەیان بەرز ترن.**

**ه/ لە کاتی ناو هێنان یاندا سلاّت و سەلامی پەروەردگاریان بۆ داوابکەین و بڵێین : پێغەمبەران ـ سەلاّت و سەلامیان لە سەر بێ ـ**



# پایەی پێنجەم باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی

**پ١/ واتای بڕوابوون بە ڕۆژی دوای چییە؟**

**و/ بڕوابوونی تەواوە بە هاتنی ڕۆژی دوای و ئەو شتانەیش کە پەیوەندی دارن بەو ڕۆژەوە وەك بڕوابون بە نیشانە گەورە و بچوکەکانی ڕۆژی دوای و سزا و تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ و کۆبونەوەی بەندەکان لە بەردەستی خوای پەروەردگار و دانانی میزان و کێشانی کردەوەکان و پردی سیرات و حەوزی کەوسەر و شەفاعەت و خۆشییەکانی بەهەشت و ناخۆشییەکانی دۆزەخ.**



**پ٢/ ناوەکانی ڕۆژی دوای چەندن و کامانەن؟**

**و/ خوای گەورە زۆر جار لە قورئانی پیرۆزدا باسی ڕۆژی دوای کردووە و هەرجارەی بەشێوازێك ناوی بردووە وەك :الحاقة ، القارعة ، الواقعة ، الغاشية ، القيامة، الساخة ، يوم الدين ، يوم الحساب ، يوم التناد ، يوم الخلود ، يوم الخروج ، يوم الحسرة.**

---

**پ٣/حیکمـەت چـییە لـە زۆر دووپاتکردنـەوەی باسـی ڕۆژی دوای ؟**

**و/ بۆئەوەیە کـە مرۆڤـەکان گرنگـی بـەکار و کـردەوەی بـاش بـدەن و خۆیـان بـۆ ئـەو ڕۆژە سـەختە ئامـادە بکـەن چـونکە ئادەمیزادەکان زۆر جـار توشـی بـێ ئاگـای و لـە بـیر چـونەوە دەبن و پێویستیان بە بیر هێنانەوە دەبێت.**



**پ٤/ئایا کەس دەزانێت کەی ڕۆژی دوای دێت؟**

**و/ نەخێر هیچ کەسێك نازانێت ئەو ڕۆژە کـەی دێـت کاتێـك جوبرەئیل پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلى الله علیـە وسـلم لە بارەی هاتنی ئەو ڕۆژەوە؟ لەوەلآمـدا پێـی فـەرموو:(( ما المسـؤول عنهـا بـأعلم مـن السـائل ))** ئیمـامی بوخـاری وموسـلیم گێڕاویەتییەوە.

**واتە: پرسیار لـێ کـراو شـارەزاتر نییـە لـەو کەسـەی پرسـیار دەکات،یەعنی منیش نایزانم.**



**پ٥/ئایا پرسیارەکانی ناو گۆڕ چەندن و کامانەن؟**

**و/ پرسیارەکانی ناو گۆڕ سیانن و بریتین لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم:پرسیار دەکرێت پەروەردگاری تۆ کێیە؟**

**ئەگـــەر مردووەکـــە بـــڕوادار بێـــت لـــە وەڵامـــدا دەڵێـــت: پەروەردگاری من الله یە، وەئەگەر بێ باوەڕیش بێت دەڵێت نازانم!**

**دووهەم/ پرسیار دەکرێت تۆ لەسەر چ ئاینێك بوویت؟**

**ئەگەر مردووە کە بڕوادار بێت لە وەڵامدا دەڵێت : ئاینی من ئیسلامە، وە ئەگەر بێ باوەڕیش بێت دەڵێت نازانم!**

**سێهەم/ پرسیار دەکرێت ئەو کەسە کێ بوو لە ناوتاندا بانگەوازی دەکرد؟**

**ئەگەر مردووەکە بڕوادار بێت وەڵام دەداتەوە و دەڵێت ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە و بڕوام پێ هێناوە و شوێنی کەوتووم، وەئەگەر بێ باوەڕیش بێت دەڵێت نازانم!خەڵك شتێکیان دەوت منیش دەموت!**



**پ٦/ ئایا یەکەم کردەوە چییە لە ڕۆژی دوایدا مرۆڤەکانی لەسەر دادگایی دەکرێت؟**

**و/ یەکەم کردەوە کە مرۆڤەکانی لەسەر دادگایی دەکرێت نوێژە وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:((**

**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلَاتُهُ، فَإِنْ صَلَحَتْ ، فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ ، وَإِنْ فَسَدَتْ ، فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ ))**
**الصحيحه(١٣٥٨).**

واتە: بەڕاستی یەکەم کردەوەیەك لە ڕۆژی دوایدا کە مرۆڤەکانی لەسەر دادگایی دەکرێت نوێژەکانیەتی، ئەگەر تەواو بو ئەوە سەربەرز و براوەیە وە ئەگەر خراپ و ناتەواو بو ڕەنجەڕۆ و خەسارۆمەندە.



پ٧/ ئایا بەهەشت و دۆزەخ ئێستا بوونیان هەیە؟

و/ بەڵێ بەهەشت و دۆزەخ ئێستا بوونیان هەیە و هەردووکیان ئامادەکراون وەك پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی:﴿**إذا مات أحدكم فإنه يعرض عليه مَقْعَدُه بالغداة والعشي، فإن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة، وإن كان من أهل النار فمن أهل النار**﴾ ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.

واتە: کاتێك یەکێك لە ئێوە دەمرێت لە ناو گۆڕەکەیدا بەیانیان و ئێواران شوێنی خۆی نیشان دەدرێت ئەگەر

**ئـەهلی بەهەشـت بێـت بەهەشـتی نیشـان دەدرێـت وە ئەگـەر ئەهلی دۆزەخیش بێت دۆزەخی نیشان دەدرێت.**

**خـوای گـەورە بەهەشـتمان پـێ ببەخشـێت و لـە دۆزخ بـە دوورمان بگرێت.**



## پایەی شەشەم باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر

**پ١/ واتای باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەر چییە؟**

**و/ باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەر بریتییە: لە باوەڕ بوون بەوەی کە هەموو خێر و شەڕێك بە قەزاو قەدەری پەروەردگار ڕوودەدات و هیچ شتێك لە ژێر ویست و ئیرادەی ئەو ناچێتە دەرەوە، پرسیار لە پەروەردگار ناکرێت لە بارەی کار و بڕیارەکانی چونکە کار و بڕیارەکانی ئەو پڕن لە حیکمەت و دانایی بەڵکو بەندەکان لێ پرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت.**



**پ٢/ پلەکانی باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەر چەندن و کامانەن؟**

**و/ پلەکانی باوەڕ بوون بە قەزا و قەدەر چوارن کە بریتین لە مانەی خوارەوە:**

**یەکەم: باوەڕ بوون بەوەی کە خوای گەورە عیلمی بەسەر هەموو شتێکدا هەبووە بە کورتی و درێژی، هەموو شتێکی زانیوە لەسەر درووستکراوەکانی بەر لەوەی درووستیان بکات وەك بژێوی و تەمەن و ژیان و مردن و کار و کردەوەیان**

بەئاشکرا و نهێنی،وەکیٚ لەوان ئەهلی بەهەشتە و کێیش لەوان ئەهلی دۆزەخە، وەك پەروەردگار فەرموویەتی:﴿**وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا** (١٢)﴾ سورەتی تەلاق.

واتە:بەڕاستی عیلمی خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە.



دووهەم: باوەڕ بوون بەوەی کە خوای گەورە هەموو ئەم شتانەی لە لەوحول مەحفوزدا نوسیوە، وەك پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم فەرموویەتی:((**کتب اللّه مقادیر الخلائق قبل أن یخلق السماوات والأرض بخمسین ألف سنة**)) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتییەوە.

واتە: خوای گەورە ئەندازە گیری هەموو شتێکی دروستکرا وەکانی خۆی کردووە پێش پەنجا هەزار ساڵ لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی.



سێهەم: باوەڕ بوون بە جیٚ بەجیٚ بوونی ویست و ئیرادە و قودرەتی خوای گەورە کە هیچ شتێك ناتوانێت دەستەوسان و بیٚ دەستەلاٚتی بکات، هەموو ڕووداوەکان بە ویست و

**ئـیرادەی پـەروەردگار ڕوو دەدەن و هەرشـتێك پـەروەردگار ویستی لیٚ بـو دەبێـت وە هـەر شـتێك ویستی ئـەوی لەسـەر نەبوو نابێت وەك پەروەردگار فەرموویـەتی:﴿ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ .....( ٢٧ )﴾ سورەتی ابراهیم.**

**واتە: خوای گەورە ویستی لەسەر هەرشتێك هەبیٚ دەیكات.**



**چـوارەم: بـاوەڕ بـوون بـەوەی كـە هـەموو بوونـەوەر لەلایـەن پـەروەردگارەوە بـە تـەنها درووسـتكراوە و هـیچ كەسـێك هاوبەشـی نـەكردووە و یارمـەتی نـەداوە لـە درووسـتكردنیدا چـونكە پـەروەردگار بەسـەر هـەموو شـتێكدا بـە توانایـە و پێویسـتی بـە كـەس نییـە وەك پـەروەردگار فەرموویەتی:﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ...( ١٦ )﴾سورەتی رەعد.**

**واتە: بێگومان پەروەردگار بە دیهێنەری هەموو شتێكە.**



**پ٣/ ئایا درووستە قووڵ بونەوە لە باسی قەزا و قەدەردا؟**

**و/ قــەزا و قــەدەر نهێنــی خــوای گەورەیــە لــە نــاو درووسـتكراوەكانیدا هـەر بۆیـە هـیچ فریشـتەیەكی نزیـك و**

**پێغەمبەرێکی نێردراویش ـ سەلاّت وسەلامیان لەسەر بێ ـ لێی ئاگادار نین.**

**کەواتە:لەسەرمان پێویستە بڕوامان بە قەزا و قەدەر هەبێت و ملکەچ و گوێڕایەڵ و ڕەزامەند بین بە بێ ئەوەی بە شوێن گوماندا بگەڕێین و لەم بابەتە زۆر بکۆڵینەوە، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی:**

**(( ...... وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا )) الصَّحِيحَة (٣٤).**

**واتە: هەرکاتێك باسی قەزا و قەدەر کرا زمانتان بگرن.**



## پلە و پایەی یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

**پ/١ ئایا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی پلە و پایەی یارانی کردووە؟**

**و/ بەڵێ خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بە جوانترین شێوە وەصفی یارانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کردووە وەك فەرموویەتی:﴿ وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠)﴾** سورەتی تەوبە.

**واتە:خوای گەورە ڕازی بووە لە پێشەنگی کاروانی بڕواداران لە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەشی بە چاکی شوێنیان کەوتوون خوای گەورە لەوان ڕازی بووە و ئەوانیش ڕازین بە پاداشتی پەروەردگار و باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون کە چەندین ڕوباری بە ناودا دەڕوات و بە هەمیشەیی لە ناویدا دەمێننەوە و ئەمەش سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە.**

**پ٢/ ئایا هیچ کەسێك لە دوای یاران ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ دەگاتە پلە و پایەی ئەوان؟**

**و/ نەخێر هیچ کەسێك لە دوای یاران ناگاتە پلە و پایەی ئەوان وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(( لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا ، مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ ، وَلَا نَصِيفَهُ ))** ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

**واتە: جوێن بە یارانم مەدەن، جوێن بە یارانم مەدەن، سوێند بە و خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە ئەندازەی شاخی ئوحود ئاڵتون ببەخشێتەوە پاداشتەکەی ناگاتە مشتێك یان نیوە مشتێکی ئەوان.**



**پ٣/ئایا درووستە زیادەڕەوی بکەین لە خۆشەویستی یەکێك لە یاران ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ ؟**

**و/ نەخێر ڕەوانییە زیادە ڕەوی بکەین لە خۆشەویستی یەکێك لە یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەڵکو لە سەرمان پێ ویستە هەموویانمان خۆش بوێت بە بێ**

زیادەڕەوی کردن، چونکە خۆشەویستی ئەوان خۆشەویستییە بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.



پ٤/ خەلیفەکانی ڕاشیدین کامانەن ـ خوایان لێ ڕازی بێ؟

و/ چوار خەلیفەکەی دوای وەفاتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە خەلیفەکانی ڕاشیدین دادەنرێن کە بریتین لە ئیمامی ئەبوبکری صدیق و ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب و ئیمامی عوسمانی کوڕی عەفان و ئیمامی علی کوڕی ئەبوتالیب خویان لێ ڕازی بێ.



پ٥/بەکێ دەوترێت هاوەڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم؟

و/ بەوانە دەوترێت کە بە ئیمانەوە بەخزمەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گەیشتوون و بە ئیمانیشەوە کۆچی دوایان کردووە.



٦/ حوکمی ئەو کەسانە چییە لە شەرعدا کە سوکایەتی دەکەن بە یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و بە هەڵگەڕاوە و خراپەکار ناویان دەبەن؟

**و/ ئەوانەی سوکایەتی دەکەن بە یارانی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و بە هەڵگەڕاوە و خراپەکار ناویان دەبن بێ گومان بەو کارەیان بێ باوەڕ دەبن و لە چوار چێوەی ئیسلام دەچنە دەرەوە، چونکە سوکایەتی کردن بە ئەصحاب سوکایەتی کردنە بە شەخصی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وەك پێشەوا مالك ئاماژەی پێکردوە.**



**پ٧/ ئەو دە هاوەڵە کامانەن کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە؟**

**و/ ئەو دە هاوەڵەی کە مژدەی بەهشتیان پێدراوە بریتین لە مانەی خوارەوە:**

**١/ ئەبوبکری صدیق خوای لێ ڕازی بێ.**

**٢/ عومەری کوڕی خەتاب خوای لێ ڕازی بێ.**

**٣/ عوسمانی کوڕی عەفان خوای لێ ڕازی بێ.**

**٤/ علی کوڕی ئەبی تالیب خوای لێ ڕازی بێ.**

**٥/ زوبەیری کوڕی عەوام خوای لێ ڕازی بێ.**

**٦/ تەڵحەی کوڕی عبیدالله خوای لێ ڕازی بێ.**

**٧/ عبدالرحمن ی کوڕی عەوف خوای لێ ڕازی بێ.**

**٨/ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص خوای لێ ڕازی بێ.**

**٩/ ئەبو عبیدەی کوڕی جەڕاح خوای لێ ڕازی بێ.**

**١٠/ سەعیدی کوڕی زەید خوای لێ ڕازی بێ.**



**پ٨/ ئەولیاکانی خوای گەورە کامانەن؟**

**و/ ئەولیاکان بریتین لە وانەی کە بڕوایان بە خوای پەروەردگار هێناوە و خۆیان لە تاوان و خراپەکاری پاراستووە و شوێنی سونەتەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کەوتوون،وەك خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ (٦٣)﴾** سورەتی یونس.

**واتە: بەڕاستی دۆستانی پەروەردگار نەترس و بیمی دوارۆژ ڕوویان تێ دەکات و نەغەم و پەژارەی دونیا دایان دەگرێت، ئەو دۆستانە ئەوانەن کە بڕوایەکی بتەویان بە پەروەردگار هێناوە و خۆیان لە تاوان دەپارێزن.**

**پ٩/ کێن ئەوانەی کە لە فیتنەکانی دونیا و سزای دواڕۆژ پارێزراون؟**

**و/ ئەوانە بریتین لە دەستەی ڕزگار بوو کە لە حەفتاو دوو فیرقە گومڕاکە جیابونەتەوە و دەستیان گرتووە بە ڕێبازی ڕاست و درووستی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و یارانییەوە وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(( مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي ))** الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (١٨/ ١٨٠).

**واتە: دەستەی ڕزگار بوو ئەوانەن کە لەسەر ئەو ڕێبازەن ئەمڕۆ من و یارانمی لەسەرە.**



## پلە و پایەی زانایان ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێ بێ

پ١/ زانایانی ڕاستەقینە کامانەن؟

و/ زانایانی ڕاستەقینە بریتین:لە وانەی کە شارەزان لە شەریعەتی ئیسلام و بەجوانی لە دەقەکانی قورئان و سوننەت تێگەیشتوون و کردەوەی پێ دەکەن و شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی ڕیبازی پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم و پێشینی چاکی ئومەتی ئیسلامن و دەمارگیریان بۆ کەس نییە.



پ٢/ سیفەتەکانی زانایانی ڕاستەقینە کامانەن؟

و/ بەکورتی سیفەتی زانایانی ڕاساڵ بریتین لەمانەی خوارەوە:

أ/ ئەوانەن کە بەدڵ مەدح و پیاهەڵدانیان پێ ناخۆشە و خۆیان هەڵناکێشێن بەسەر خەڵکدا و هەتا زانستیان زۆرتر بێت ملکەچی وخۆبەکەم زانیان زیاتر دەبێت.

ب/ ئەوانەن کە ڕادەکەن لە ڕیياسەت و ناو دەرکردن ، خۆ ئەگەر خوای گەورە شتێکی وایشی پێ دابن زۆر ترساون لە دەرەنجامەکەی.

ج/ ئەوانەن کە بانگەشەی خاوەنداریێتی زانست ناکەن بۆ خۆیان و غەیری خۆیان بە نەزان و نەفام لە قەڵەم نادەن

**،مەگەر ئەوانەی کە پێچەوانەی سوننەت دەکەن و بیدعەکارن ئەو کاتە بۆ پارێزگاری لە ئیسلام قسەیان لەسەر دەکەن و هەڵەکانیان ڕوون دەکەنەوە.**

**د/ ئەوانەن کە گومانی خراپ بە نەفسی خۆیان دەبەن و گومانی چاك بە زانایانی پێش خۆیان دەبن و زۆر دۆعای خێریان بۆ دەکەن.**



**پ٣/ ئایا زانایان مافیان هەیە لەسەرمان ؟**

**و/ بەڵێ زانایان مافیان زۆرە لەسەرمان وەك: ڕێزلێگرتنیان و گوێڕایەڵی کردنیان لە چوارچێوی شەرعدا و دۆعای خێر بۆ کردنیان چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(( وَإِنّ العَالِم لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْبَحْرِ ))** الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (١/ ٢٥٠).

**واتە: ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەتاوەکو ماسی ناو دەریاکانیش دۆعای خێر دەکەن بۆ زانایان.**



**پ٤/پێگەی زانایان چەندە بەلای پەروەردگارەوە؟**

**و/ پێگـەی زانایـان زۆر گەورەیـە بـەلای پـەروەردگارەوە،وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:**

**(( وَفَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ،كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَـدْرِ عَلَـى سَـائِرِ الْكَوَاكِبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ،إِنَّ الْأَنْبِيَـاءَ لَـمْ يُوَرِّثُـوا دِينَـارًا وَلَا دِرْهَمًا،إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ ، فَمَنْ أَخَذَ بِـهِ أَخَـذَ بِحَظٍّ وَافِـرٍ))**الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (١/ ٢٥٠).

**واتـە: گـەورەیی زانایـان بەسـەر بـاقیی خواپەرسـتانەوە وەك گەورەیی مانگی چواردە وایـە بەسـەر ئەستێرەکانەوە،بێگومـان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ـ سەلات و سەلامیان لەسـەر بـێ ـ پێغەمبـەران دینـار و درهـەمیان بـەجێ نەهێشـتووە بـەڵکو زانستیان بەجێ هێشـتووە،هەرکەسێك ئـەو زانسـتە وەربگرێـت بەشێکی گەورەیی بۆ خۆی بە دەستهێناوە.**



**پ٥/ ئایا گرێدانی موسڵمانان بە زانایانەوە بـە کـارێکی شـەرعی دادەنرێت؟**

**و/ بەڵێ گرێدانی موسڵمانان بـە زانایانـەوە بـە بنەمایـەکی زۆر گرنگ دادەنرێت لە بنەماکانی ئەهلی سوننە چونکە موسڵمانان**

بە هۆی نزیکیانەوە لە زانایان بیر و باوەڕی ڕاست و درووست و مەنهەجی پاك وەردەگرن و پارێزراو دەبن لە لادان و گومڕایی و لاڕێ بوون،وەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ڕێنموونیمان دەکات بگەڕێینەوە بۆ لای زانایان لە کاتێکدا دووچاری نەزانین بووین وەك فەرموویەتی: ﴿**فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ** (٤٣)﴾ سورەتی نەحل.

واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای زانایان و پرسیاریان لێ بکەن ئەگەر شتێکتان نەدەزانی و سەرتان لێی دەرنەدەچوو.



پ٦/ ئایا حوکمی ئەو کەسانە چییە کە تانە و تەشەر دەدەن لە زانایان؟

و/ تانە و تەشەر دان لە موسڵمانان بە گشتی تاوانێکی گەورەیە و بێگومان بەرامبەر زانایان تاوانەکەیان گەورەترە چونکە دەبێتە هۆکاری بەکەم سەیرکردنی ئەو زانست و حیکمەت و تێگەیشتنەی کە پێیانە بەڵکو ڕیزلێگرتنیان بە واجبێکی شەرعی دادەنرێت وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((**إِنّ مِنْ إِجْلَالِ اللهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ وَحَامِلِ**

**الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السّلْطَانِ الْمُقْسِطِ** )) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (٨/ ٣٧٠).

**واتە:بەڕاستی لە بەگەورە دانانی خوای گەورەیە:**

**١/ ڕێزگرتن لەو موسڵمانانەی کە موویان سپی کردووە و چوونەتە ناو تەمەنەوە.**

**٢/ ڕێزگرتن لەو کەسانەی کە - ئەهلی قورئانن - خاوەن زاستی شەرعین و زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی تیادا ناکەن.**

**٣/ ڕێزگرتن لە دەسەلاتداری دادپەروەر.**



# مافی كاربەدەستان لەسەر موسڵمانان

**پ ١/ ئایا لەسەر مان پێویستە گوێڕایەڵی كاربەدەستان بكەین؟**

**و/ بەڵێ لەسەر مان پێویستە گوێڕایەڵی كاربەدەستان بكەین وەك خوای گەورە فەرموویەتی:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ.(٥٩)﴾سورەتی نیساء.**

**واتە: ئەی بڕواداران گوێڕایەڵی خوای گەورە و گوێڕایەڵی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بكەن، وە گوێڕایەڵی كاربەدەستانێك بكەن كە لە خۆتانن ـ یەعنی موسڵمانن ـ.**

**بەڵام گوێڕایەڵی كاربەدەستان بەستراوەتەوە بە گوێڕایەڵی كردنی پەروەردگارەوە و نابێت پێچەوانەی شەرع بێت وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی :((لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (٤٤٣/٣٦).**

**واتە:گوێڕایەڵی كەس ناكرێت لەسەر پێچی فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی صلى الله عليه وسلم گوێڕایەڵی تەنها لە چاكە كاریدایە نەك لە كاری خراپدا.**

**پ٢/ ئایا بەرهەڵستی کردن و دژایەتی کردنی کاربەدەستان بەکارێکی ڕوا دادەنرێت؟**

**و/ نەخێر بەرهەڵستی و دژایەتی کردنی کاربەدەستان بە کارێکی حەرام دادەنرێت لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:**

**یەك: پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە و لاسایکردنەوەی بێ باوەڕانە.**

**دوو:دەبێتە هۆی درووست بوونی ئاژاوە و بشێوی و نەمانی ئارامی و هێمنی.**

**سێ:زۆربەی جار هیچ سوودێکی نابێت جگە لە کاول کاری وولآت.**

**چوار:هۆکارێکە بۆ بالآدەست بوونی بێ باوەڕان بەسەر وولآتاندا و بەتالآن بردنی خێر و خێراتەکەی.**



**پ٣/ ئایا درووستە ئامۆژگاری کاربەدەستان بکرێت بۆ کاری چاك؟**

**و/ بەڵێ درووستە لە نزیکەوە ئامۆژگاری کاربەدەستان بکرێت لە لایەن کەسانی خاوەن زانست و حیکمەتەوە و خوای گەورەیان وە بیر بهێنرێتەوە، وەك پێغەمبەر صلی الله علیە**

**وسلم فەرموویەتی: ((مَنْ أَرَادَ أَنْ يَنْصَحَ لِسُلْطَانٍ بِأَمْرٍ فَلَا يُكَلِّمْهُ بِهَا عَلَانِيَةً وَلَكِنْ لِيَأْخُذْ بِيَدِهِ فَيَخْلُو بِهِ، فَإِنْ قَبِلَ مِنْهُ فَذَاكَ، وَإِلَّا ،كَانَ قَدْ أَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ لَهُ)) الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (٦/٤٤١).**

**واتە: هەر کەسێك ویستی ئامۆژگاری کاربەدەستان بکات بەشتێك با بەئاشکرا پێی نەڵێ بەڵکو دەستی بگرێت و بە تەنها ئامۆژگاری بکات، ئەگەر لێی وەرگرت زۆر باشە، وە ئەگەر لێی وەرنەگرت ئەوە ئەو کاتە ئەم کاری خۆی بەجێ هێناوە.**

**کەواتە: پێویستە ئامۆژگاری کاربەدەستان بە نەرمی و بە نهێنی بکرێت نەك لە پێش چاوی خەڵك و شکاندیان ........**



سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە لە شەوی عەرەفە تەواو بوم لە نوسینی ئەم نامیلکەیە داواکارم لە خوای گەورە بیکاتە توێشوی دوارۆژ و ڕوناکی چاوی جگەر گۆشەکانمان.

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين.**

---

**محسن محمود سليمان**

**پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی صەلاحەدینی ئەیوبی/ زەڕایەن**

**٩/ ١٢/ ١٤٣٧ك** **١١/ ٩/ ٢٠١٦ ز**

